# سەرچاوەکانی أیمامی تەبەری

## لەسەر فیتنەی نێوان هاوەڵان

نووسینی:

پرۆفیسۆر دکتۆر محمد امحزون

وەرگێڕانی:

نهاد جلال حبیب الله

١٤٣٢کۆچی

بسم الله الرحمن الرحيم

**ناوی کتێب: سەرچاوەکانـــــی ئیمامی تەبەری لەسەر فیتنەی نێوان هاوەڵان**

**نووسەر: نهاد جلال حبيب الله**

**چاپ: یەکەم-ساڵی١٤٣٢کۆچی**

## سەرچاوە سەرەکیەکانی ئیمامی تەبەری بۆ نووسینی لەسەر فیتنەی نێوان هاوەڵان(رضي الله عنهم)

*لـە ماوەیـەکی سـەرەتاوە نووسـین لـە بـواری میـژوودا لای* موسڵمانان دەرکـەوت و لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی یەکـەمی کۆچیدا یەکـەمین ئـەو کتێبـە مێژووییانـە درکـەوتن کـە گرنگیـان دەدا بـە ژیاننامـەی پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم)، دواتـر دانـراوە مێژووییـەکانی سـەدەی دووەمـــی کۆچـــی چارەســـەری ڕووداوە گرنگـــەکانی مێـــژووی ئیســـلامییان دەخســـتە ڕوو وەك ڕووداوەکـــانی هەڵگەڕانـــەوە لـــە ئیسـلام و فتوحـاتی ئیسـلامی و فیتنـەی نێـوان موسـڵمانان و ئـەو شەڕو ڕووداوانەی پەیوەستن بەوانەوە وەك شەڕی جەمەل و صفین و مەســـەلەی دادوەری و شـــتی لەوشـــێوە. ئـــەو نووســـینانە بـــە نووسینە هەواڵیەکان و دانەرەکانیشیان بە(الاخباری)ناسران.

کـاتێ گەشەسـەندنێ لـە نووسـینی مێـژوویی لـە سـەدەی سـێیەمی کۆچـیدا ڕوویـدا، ئـەو گـەورە مێژوونووسـانە دەرکـەوتن کـە شـتێکی زۆریان لەو نووسینانەی پێشوو وەرگرت و سەرلەنوێ دایانڕشتەوەو لە چەند دانراوێکی گەورەدا پەیوەستی یـەکتریان کـردن و نووسـینەکانیان بـە کتێبـەکانی مێـژوو ناسـران.[1] لەسـەروو هـەموو ئەوانەشـەوە ئیمـامی

---

[1] – فرانزروزنتال: علم التاريخ عند المسلمين" د. سامی الصقار: علم التاريخ عند المسلمين.

تەبـەری دەیـت كـە لـە پـیش خۆیـەوە ژمارەیـەكی زۆری سەرچـاوە هەواڵگیڕەوەییەكانی بەدیكرد و شتی لیوەرگرتن تا میژووە گەوركەی پیكبینیَ.

لـەو كتیبەیـدا لـە كۆكردنـەوەی سەرچـاوەكان و شـارەزابوون لـە دانراوەكانی پیش خۆی و هەڵبـژاردن و وەرگرتنـی گیڕانەوەكانـدا توانایەكی زۆری نیشاندا.

لە نوسینەكەیدا پشتی بە دوو ڕەوتـی سەرچاوەیی بەستووە، زارەكـی كـە بـە بیسـتن لـە مامۆسـتاكانی وەریگرتووە.بـۆ ئەمـەش دەربڕینـی(حـــدثنی)یـان(اخبرنـی)[2]، چـەند دانـراویكیش كـە لـە گیڕانـەوەكانی وەرگرتـووە و لیـی هینـاون وەك لـە نوسـینەكانی واقـدی و ئەبوومـوخەنـەف، بـۆ ئەمـەش دەقـی(ذكـــر)یـان(قـال) یان(زعم)دینیَ.[3]

لەبەرئـەوەی گیڕانـەوە ڕیـڕەوی جـیَ حـەزی خـودی ئیمـامی تەبەریە و گیڕانەوەش لە ڕیی سەنەدەوە پیویستی هینانی ناوی كتیبـەكان نـاخوازیَ، بۆیـە نـاوی گیڕەرەوەكـە لـەبری كتیبەكـەی

---

[2] – الطبری: تاریخ الرسل و الملوك" بۆ نموونە بڕوانە ج٤ ص٣٣٥.

[3] – هەمان سەرچاوە: بۆ نموونە بڕوانە(ج٤ ص ٣٧٢، ٣٧٥، ١٦٠).

دێنێ. تێبینی ئەوە دەکەین ئیمامی تەبەری دەستبەردار بووە لە هێنانی ناوی ئەو سەرچاوە و کتێبانەی کە پشتی پێبەستون. تەنها لەچەند شوێنێکی دیاریکراو و کەمیشدا لەو بنەمایە لایداوە، وەك ئەم دەقەی(حدثنی عمر – ابن شبة- مرة اخری فی کتابه الذی سماه کتاب(اهل البصرة)فقال...)[٤](عومەری کوڕی شوببەه جارێکی دی لەو کتێبەیدا کە ناوی ناوە(اهل البصره)بۆی گێڕامەوە و وتی)

دیارە ئەو ڕێ و شوێنانەشی سەختی و بەربەست دێننە بەردەم لێکۆڵەران سەبارەت بە ناسینی سەرچاوەکانی، چونکە زانایان یان ئەو مامۆستایانەی کە ئیمامی تەبەری شتی لە کتێبەکانیانەوە هێناوە و تەنها لە سەنەدەکەیدا ناوی هێناون هەریەکەیان چەندین نووسینیان هەیە و ناتوانرێ بزانرێ کام سەرچاوەی پێ مەبەستە.

ئەوەی جێی ئاماژەپێکردنە ئیمامی تەبەری لە کاتی نووسینی لەسەر مەسەلەی فیتنە پشتی بە چوار سەرچاوەی سەرەکی بەستووە، ئەوانیش کتێب یان گێڕانەوەکانی ئەم کەسانەن: سەیفی کوڕی عومەری تەمیمی، موحەممەدی کوڕی عومەری واقدی، عومەری کوڕی شوببەهی نومەیری، ئەبو موخنەف لووطی کوڕی یەحیا.

---

٤ – هەمان سەرچاوە، ج٥ ص ٢٩٧

سەبارەت بە فیتنەکانی سەردەمی عوسمان(رضي الله عنه)و کوژرانی‌پشتی بەستووە بە سەیفی کوڕی عومەر کە گێڕانەوەی ئەو پێشدەخات و دواتر چەند گێڕانەوەیەکی دیکە لە واقیدیەوە دێنێ.

بۆ شەڕی جەمەل و ڕووداوەکانی پێشتری وەك بەیعەتدان بە عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه)و دەرچوونی تەلحە و زوبەیر و عائشە(رضي الله عنهم)بۆ بەسرە پشتی بەستووە بە گێڕانەوەکانی عومەری کوڕی شوببەه و دواتر گێڕانەوەکانی سەیفی کوڕی عومەری لەسەر دێنێ.

سەبارەت بە شەڕی(صفین)و ڕووداوەکانی دواتری وەك ڕووداوی دادوەری و جەنگی عەلی(رضي الله عنه)لەگەڵ خەواریج و ڕووداوگەلێکی دی ئەوا پشت دەبەستێت بە ئەبوومیخنەف و گێڕانەوەی ئەو پێشدەخات.

ئەمە سەرەڕای چەند سەرچاوەیەکی دی کە بە پلەی دووەم دێن و خۆیان دەبیننەوە لە گێڕانەوەکانی چەند مامۆستایەکی کە جارجارە نێوان دەخەنە نێو ئەو سەرچاوە باسکراوانە.

## یەکەم:سەیفی کوڕی عومەری تەمیمی:

سـەرەتا سەرچـاوەی یەکـەم دێـنین کـە سـەیفی کـوڕی عومـەری تەمیمی ضببی ئەسەدیە کە لـە ساڵی ١٨٠ك/ ٧٩٦ز. مـردووە. ئـەم کەسایەتییە بـەوە ناسـراوە کـە شـارەزایی بـەرفراوانی هەیـە لەسـەر مێژووی ئیسلامی. نووسـینەکانی لای مێژوونووسان ناوبانگێکی بـەرفراوانیان هەیـە، بەتایبـەت ئـەو نووسـینانەی لەسـەر شـەڕی هەڵگەڕانەوە و فتوحاتەکان و ڕووداوەکانی فیتنە داینـاون.

سـەیف زانسـتی خـۆی لـە کەسـە ئیخباریەکانـەوە هێنـاوە وەك هیشامی کوڕی عروەی کوڕی زوبەیر[٥] و مووسای کـوڕی عوقبـە[٦] و

---

[٥] – هیشـامی کـوڕی عـروەی کـوڕی زوبـەیری کـوڕی عـەوامی ئەسـەدی قورەیشی ئەبولمونزیر لە گەورە هەواڵگێڕەرەوە و پێشـەوایێنی فەرموودەیەکە کـە زانایـانی وەك(ئـیبن سـەعد و ئـەبو حاتـەم و عجلـی و ئـیبن موعین)بـەجێ متمانەی دەزانن، لە ساڵی ١٤٥ك. مردووە

[٦] – مووسـای کـوڕی عوبـەی کـوڕی ئـەبو عـەییاش ئـەبو موحەممـەد لـەجێ متمانـە تایبەتمەنـدەکانی ژیاننامـەی پێغەمبـەر(ﷺ)ئیمـامی مالیـك وەسـفی نوسـینەکانی لەسـەر غـەزاکان دەکات. ئیمـامی وخـاریش لـە صـەحیحەکەیدا پشتی پێ بەستوون. ئەحمەد و ئیبن مـوعین و نەسائی و ئـەبو حاتـەم و ئـیبن حبان بەجێ متمانەی دەزانن، لە ساڵی ١٤١ك. مرد.

**موحەممەدی کوڕی سائیبی کەلبی[٧] و موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و هاوشێوەکانی.**

**هەروەهاهەواڵەکانی سەبارەت بە فیتنە لە مامۆستاکانیانەوە دێنێ کە بریتین لە: موحەممەدی کوڕی نوەیرە[٨] و تەلحەی کوڕی ئەعلەم[٩] و عەتییەی کوڕی حارث ئەبورِقی و هەمەدانی[١٠].**

---

**[٧] – موحەممەدی کوڕی سائیبی کوڕی بیسر ئەبو نەصری کەلبی هەواڵگێڕەوەی موخەسیرە، لە زانستی(الانساب)پێشڕەوە، بەڵام شیع یە و فەرموودەی وەرنەگیراو جێ متمانە نییە، ئیبن حبان دەڵێت: سبەئیە، لەوانەی دەڵێن عەلی نەمردووە و دەگەڕێتەوە بۆ دنیا، ئەگەر هەورێ ببینن دەڵێن ئەمیری باوەڕدارانی تێدایە، ئەحمەد دەڵێت: تەفسیرەکەی کەلبی درۆیە و درۆ نیە سەیری بکەیت. لە ساڵی ١٤٦ك. مرد.**

**[٨] – موحەممەدی کوڕی نوەیر لە مامۆستاکانی سەیف لە ئوم عوسمان لە ئەبو موکنەفەوە گێرانەوەی هێناوە. بڕوانە ابن حاتم الحجر و التعدیل ج٨ ص ١١٠**

**[٩] – تەلحەی کوڕی ئەعلەم ئەبولهەیمی حەنەفی ەلرەی دانیشتووە و وسفیانی شەوری و سەیف فەرموودەیان لێوەرگرتووە، بڕوانە ابن معین: التاریخ ج٢ ص ٢٧٧، ابن ابی حاتم ج٤ ص ٤٨٢**

**[١٠] – عەتیەی کوری حارپ ئەبو ڕەوقی هەمدانی کوفی لە گێڕەرەوانی کوفەیە.فەرموودەی لە ئەنەس و عکرمە و شەعبی و زوحاك و هی دیکەش**

=

ئەوانە ئەو باسەیان بە شێوەیەکی لەیەکچوو هێناوە، ئەویش دوای ئەوە ناویان دێنیٚ دەڵێت: ئەوانە دەڵێن،[11] دواتر ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە. وەك ئەوەی تا ئاستێکی بەرچاو لەسەر ڕووداو و وردەکاریەکانی فیتنەکە یەکدەنگ بن و ئەوە دەگەیەنێت سەرچاوەکانیان یەك شت بیٚ.

لە مامۆستاکانی ئەوانیش بریتین لە: یەزیدی فەقعەسی تەمیمی ئەسەدی[12] کە چینەکەی ئەوە دەگەیەنێت لە کۆتاییەکانی سەدەی یەکەمدا ژیابێت، چیرۆکی عەبدوڵلای کوڕی سەبەئو بزووتنەوە و هاتوچۆ و پەیوەندیەکانی لەگەڵ ناوچەکان لەوەوە دێنیٚ، ئەمەش ئەگەر واتایەك ببەخشیٚ ئەوە دەگەیەنێت کە گێڕانەوەکەی سەیف زۆر لەپێشترە بەوەی لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا.

پاش ئەوەی زانای فەرموودەناس ئیبن کەپیر گێڕانەوەکانی سەیف لەسەر ڕووداوی جەمەل پوختی دەکاتەوە بە گێڕانەوەی سەیف و

---

=

گێڕانەوە و ئەحمەد و نەسائی و فەسەوی دەڵێن گرفتی نیە ئیبن موعین دەڵێت چاکە. ئەبو حاتەم دەڵێت زۆر ڕاستگۆیە، نووسینی تەفسیری هەیە

[11] – الطبری: تاریخ الرسل و الملوك. ج٤ ص ٣٤٨.

[12] – لە سەرچاوەکانی بەردەستدا ژیاننامەیم نەدۆزیوەتەوە.

**ماموٚستاکانی لەسەر فیتنە و دەڵێت(ئەمە پوختەی ئەوەیە کە ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر(رضي الله عنه)لە پێشەواکانی ئەوبارەوە- سەیف و ماموٚستاکانی- دەیهێنێ)[13]**

**لە نووسینەکانی سەیف بریتیبوون لە: کتێبی(الفتوح الكبير و الردە)[14] کە ناوبانگی دەرکرد تا سەیفی پێ ناسرا. ئیمامی طبري لە باسی هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلامدا پشتی بەستووە بەو کتێبە و گێڕانەوەکانی پێش هەموو ئەو گێڕانەوانەی دیکە دەخات کە لەسەر هەڵگەڕانەوە هاتوون.[15]ئیبن نەدیمیش نووسینێکی دیکەی باس دەکات و ناوی ناوە(کتاب الجمل و مسير عائشه و على)[16]ئەوەش ئەو کتێبەیە کە ئیمامی تەبەری گێڕانەوەکانی سەیفی لەسەر شەڕی جەمەل لێوە هێناوە.[17]**

**تایبەتمەندی ئەم دانراوە ئەوەیە کە سەیف لە چەند سەرچاوەیەکی نزیکی ڕووداوەکانەوەهەواڵەکانی ئەو شەڕەی**

---

[13] – ابن كثير: البدايه و النهايه ج٧ ص ٢٤٧.
[14] – ابن النديم: الفهرست ص ١٣٧
[15] – الطبرى: ج٣ ص ٢٤٩-٣٤١.
[16] – ابن النديم: الفهرست ص ١٣٧.
[17] – الطبرى: ج٢ ص ٤٥٥-٥٦٢.

هێناوە، ئیمامی تەبەری لە سەنەدەکانیدا ناویان دێنێ. بەوەش چەند وێنەیەکی بنەڕەتی و ڕیشەیی هەواڵی ئەو شەڕە دڵگرانکەرەمان بۆ دەپارێزێ کە سەبەئیەت پشکێکی گەورەی هەبوو لە هەڵگیرساندنی ئاگرەکەیدا. ئیمامی تەبەری لەبارەی هەواڵی ئەو فیتنەی دژ بە عوسمان(رضي الله عنه)بەرپا بوو پشتی بەستووە بە سەیف، لەوانەش هەواڵی ئەو فیتنەی کە ئیبن سەبەء لە بەسرە و کوفە لە ساڵی ٣٣ك/ ٦٥٣ز. بەرپا یکرد. سەیف ئەو هەوالانەی لە عەتیەی کوڕی حارث لە گەورە گێڕەروانی کووفەوە وەرگرتووە.[١٨]

ڕێگەیەکی دیکەش هەیە کە ئیمامی تەبەری بۆ زانیاری وەرگرتن لە نووسینەکانی سەیفی کوڕی عەمر گرتوویەتیەبەر کە ئەویش ڕێگەی عەبدوڵلای کوڕی سەعدی زوهری بەغدادیە[١٩]کە لەشاری(سر من راى)دانیشتووە.

---

[١٨] – هەمان سەرچاوە: ج٤ ص ٣٢٦-٣٤٠

[١٩] – عوبەیدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی زوهری دادوەری ئەسبەهان بووە و بێ گرفت، ساڵی ٢٦٠ك. مردووە.

لــە بــاوکی[20] و یونســی کــوڕی موحەممــەدەوە گێڕانــەوەی وەرگرتووە، چینێکی گەورە جێ متمانەکانی وەك بوخاری و ئەبو داود و ترمـزی و نەسـائی و ئـیبن ئـەبی عاصـم و چـەندێکی دی گێڕانـەوەیان لێوەرگرتـووە.[21] عوبەیـدوڵڵا قسـەکانی سـەیفی کـوڕی عومـەری لـە یـەعقوبی کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی سـەعدی زوهـری مامیـەوە[22](کـە لـە بەغـداد دانیشـتووە و لـە گێڕەرەوەکـانی سـەیفی کوڕی عومەرە)وەرگرتووە، هەروەکلە لیستی ناوی ماموستاکانیدا ئـەوە دەبیـنین کـە تـەنها فـەرموودە نـاس نـەبووە، بـەڵکوو لـە شـارەزایانی مێـژوو و فیقهـ و شـعریش بـووە، ئیمـامی تەبـەری لـە سـەیفەوە بەزۆری ئـەم سـەنەدەی هێنـاوە:(سـرری لـە شـوعەیب لـە سەیفی کوڕی عومەرەوە بۆی نوسیم یان سرری لـە شـوعەیب لـە

---

[20] – سـەعدی کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی سـەعدی کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی عەبدورەحمان دادوەری واسـگ بـوو لـە سـەردەمی هـاروون، دواتـر دادوەری سەربازگەی مەهدی بوو لە سەردەمی مەئمون، بێ گرفتە، لـە ساڵی ٢٠١ ك مردووە.

[21] – ابن حجر: التهذیب ج٧ ص١٥.

[22] – یـەعقوبی کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی سـەعدی کـوڕی ئیـبراهیم نووسـەری غەزاکانە. جێ متمانەیە. لە ساڵی ٢٠٨ ك. مردووە.

سەیفی کوڕی عومەرەوە بۆی گێڕامەوە)ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە ئیمامی تەبەری چووەتە لای سرری مامۆستای و پرسیاری لێکردووە، ئەوەش لە نوسینەکانی سەیفی کوڕی عەمری وەردەگرت.

(لە ڕێگەی شوعەیبەوە)و دەینارد بۆی. هەروەك ئەوەش دەردەکەوێت نووسینەکانی سەیف لای سرری بوون، ئیمامی تەبەریش لەسەر ئەوە چەند بەشێکی خوێندوەتەوە.

سرری ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ئیمامی تەبەری و گێڕانەوەکانی سەیف بووە، ناوی سەیفی کوڕی یەحیای کوڕی سرری تەمیمی کووفی بووە، وەك لە سەنەدەکەی ئیمامی تەبەریدا دەردەکەوێت فەرموودەی لە شوعەیبەوە گێڕاوەتەوە. ئیبن ئەبی حاتەم لەبارەیەوە دەڵێت:(لم یقض لنا السماع منه و کتب الینا بشیء منه و کان صدوقا)واتە(ویستی خوا وانەبووە شتی لێ ببیستن. ئەو شتێ لە فەرموودەی لای خۆی بۆ نوسیووین، کەسێکی زۆر ڕاستگۆ بووە)[٢٣] بە یەکێ لەو کەسانە دادەنرێ کە ئیمامی تەبەری زۆرترین گێڕانەوەی لێ وەرگرتووە بەوەی لە مێژووەکەیدا دوو سەد و چل و هەشت دەقی لێوە گێڕاوەتەوە.[٢٤]

---

[٢٣] – ابن ابی حاتم: الجرح و التعدیل ج٤ ص ٢٨٥.

[٢٤]– محمد ابو الفضل: فهارس من تاریخ الطبری، ج١٠ ص ٢٦١.

شوعەیب: ناوی شوعەیبی کوڕی ئیبراهیمی کووفەیە، ئیبن عەددی باسی دەکات و دەڵێت(ناسراو نییە و بڕێ فەرموودە و گێڕانەوەی هەیە، جۆرە ناباشیەکی تێدایە، ئەوەی تێدا هەیە کە دەدات بەسەر سەلەفدا)[٢٥] زەهەبی لە المیزان دا دەڵێت(گێڕانەوەکانی نووسینەکانی سەیف لە شوعەیبیەوە جۆرە نەزانیەکی تێدایە)[٢٦] ئیمامی تەبەری لە مێژووەکەیدا لە ڕێگەی سرری مامۆستایەوە گێڕانەوەی لێوە هێناوە، وەرگرتنەکانی ئیمامی تەبەری لە ڕێگەی ئەوەوە زیاتر لە دوو سەد و پەنجا جار دەبێت.[٢٧]

کۆی گێڕانەوەکانی سەیف لە مێژووەکەی ئیمامی تەبەریدا دوو سەد و شەست و نۆ گێڕانەوەن، لەوانە حەفتا و سێیان لەسەر فیتنەن،[٢٨] ئیمامی تەبەری بەوجۆرە کردوویەتی بە سەرچاوەیەکی گرنگ لە گواستنەوەی هەواڵدا، ئەوەتا زیاتر لە کەسەکانی دی گێڕانەوەی لەسەر ڕووداوەکانی فیتنە لەو وەرگرتووە تا ئەوەی خەریکە تەواو پشتی پێ دەبەستێ.

---

[٢٥] – ابن حجر: لسان المیزان، ج٢ ص ١٤٥.

[٢٦] – الذهبی: میزان الاعتدال، ج٢ ص ١٤٥.

[٢٧] – محمد ابو الفضل: فهارس من تاریخ الطبری، ج١٠ ص ٢٨٤.

[٢٨] – محمد ابو الفضل: فهارس من تاریخ الطبری ج١٠ ص ٢٨٠.

فـەرمووده ناسـان لەسـەر سـەيف قسـەيانكردووه، ئـەبو حاتـەم دەڵێـت:(مەترووكـە و قسـە و گێڕانـەوەی هاوشـێوەی قسـە و گێڕانەوەی واقديـە)[29] ئـيبن موعين دەڵێت(لاوازه)[30] نەسائی و دار قوتنی دەڵێن(لاوازه)[31] ئيبن حبان دەڵێت(لەسەر چەسپاوەكان شتی هەڵبەستراو دێنێ و بە زەندەقە تۆمەتبار كراوه)[32] بەڵام ئـيبن حەجەر بەو تۆمەتە ڕازی نابێ و دەڵێت(ئـيبن حبان لە قسەكردن لەسەری خراپەی وتووه).[33]

ئێمە نازانين چۆن دروستە ئەو تۆمەتەی بدرێتە پاڵ، گێڕانەوەشی سـەبارەت بـە فيتنـە و ڕووداوی نێـوان هـاوەڵان(رضي الله عنه)زۆر دووره لەوەی كە زەندەقەكان دەيگرنەبەر، چۆن دەكرێت تۆمەتباربكرێت بەوەی زەندەقەيە لەكاتێكدا ئەو ئابڕووبەريەكانی زەندەقەی وەك ئيبن سەبەئی خستووەتە ڕوو!!

---

[29] – ابن ابى حاتم: الجرح و التعديل ج٤ ص ٢٧٨.

[30] – ابن معين: التاريخ، ج٢ ص ٢٤٥.

[31] – النسائی: كتاب الضعفاء و المتروكين، ص ١٢٣" الدار قطنی: الضعفاء و المتروكين، ص ٢٤٣.

[32] – ابن حبان: المجروحين، ج١ ص ٣٤٤.

[33] – ابن حجر: التقريب، ج١ ص ٣٤٤.

دەکرێت بڵێین گێڕانەوەکانی سەیف تەواو لەوە بەدوورن کە بخرێنە بەر باسی ئەو تۆمەتە، بەڵکوو خودی ئەوانە بەدووری دەگرن، چونکە هەڵوێستی سەیف لەسەر ئەو تۆمەتە هەڵوێستی پیاوانی سەلەفە لە ڕێزگرتن و پاکدانانی هاوەڵان لە هەر کردارێکی ناشیرین، ئەوەتا کەناری گرتووە لە ئەبو موخەنەف و واقدی و زنجیرەیەکی مێژوویی خستووەتە ڕوو کە تۆمەتبارکردنی هاوەڵانی تێدا نییە، بەڵکوو سووربوونیان لەسەر ئیسلاح و یەکدەنگی نیشان دەدات، ئەوەش ئەو ڕاستییەیە کە دەروون ئارامی پێ دەگرێ و بە ئاڕاستەی گێڕانەوە صەحیحەکانی فەرموودە ناساندا دەچێت.

ئەگەر فەرموودە ناسان لە گێڕانەوە لە کەسە لاوازەکانەوە ئاسانکاری دەنوێنن، ئەگەر گێڕانەوەکانیان پاڵپشتی فەرموودە گەلێکی صەحیحی جێ متمانە بن، ئەوکات گرفت نییە ئەو لایەنەی مێژوو بگرێتەبەر و بکرێ بە پێوەرێ بۆ ڕێکردە و گەڕان بۆ ڕاستییە مێژووییەکان و زانینی ئەو ڕاستیانە، لێرەوە هەواڵی دروست ئەوە پێوەر دەکرێت، چی لەگەڵ ئەودا گونجا وەریدەگرین، هەرچییش لەگەڵی گونجا فڕێی دەدەین.

بێگومان گێڕانەوەی سەیف زیاتر لە هی دی کاندیدە بۆ ئەو واتایانە چونکە لەگەڵ گێڕانەوە صەحیحەکانی کەسە جێ

متمانەکاندا گونجاو و یەکانگیرە، سەرەڕای ئەوەی وەرگیراوە لەو کەسانەی کە بەشدار و ئامادە بوو یان نزیکی ڕووداوەکان بوون.

بۆیە فەرموودە نووسان وەسفی سەیف دەکەن بەوەی لە بواری مێژوودا ئەزموون و شارەزایی هەیە، زەهەبی دەڵێت(هەواڵگێڕەوەیەکی شارەزا بووە)(کان اخباریا عارفا)،[٣٤] ئیبن حەجەر دەڵێت(لە فەرموودەدا لاواز و لە مێژوودا سەرچاوە و بەهێز بووە).[٣٥]

جەواد عەلی قسە لەسەر برۆکلمان دەدات– چونکە برۆکلمان سەیفی بەوە تۆمەتبار کردووە کە کاتێ هەواڵەکانی پێدەوترا وردەکاری بۆ نەکردوون و زێدەڕەوی کردووە لە پیاهەڵدانی هۆزەکەی خۆی هۆزی تەمیم – جەواد دەڵێت(ئەوەی برۆکلمان بانگەشەی بۆ دەکات کە تێبینی – ئەو سۆزدارییە خێڵەکییەی بەرامبەر تەمیم – کردووە و حەزی لێ کردووە و ناچار بووە بەشێ لە گێڕانەوەکانی نەهێنێ، ئەمە قسەیەکە کە خودی کتێبەکەی تەبەری پشتگیری ناکات، چونکە لە باسی شەڕی جەمەلدا دەبینیت گێڕانەوەکانی

---

٣٤ – الذهبی: المیزان، ج٢ ص ٢٥٥.

٣٥ – ابن حجر: التقریب، ج١ ص ٣٤٤.

لەنێو گێڕانەوەکاندا دیار و بەرچاون. پاشان نوسخەی ئەسڵی – مێژووی تەبەری – هێشتا لەبەر دەست نییە، دەی برۆکلمان چۆن زانی تەبەری گێڕانەوە گەلێکی سەیفی لە بەرز ڕاگرتنی هۆزی تەمیمیدا لابردووە)[٣٦] لە ڕاستیدا ئەو بانگەشەی دەڵێت سەیف دەمارگیری بۆ هۆزەکەی هەبووە بار و هەڵوێستی بەنو تەمیم لە پرسی فیتنەدا بەرپەرچی دەداتەوە – چونکە شتێکی بەرچاوە بەنو تەمیم لەوانە بوون کە لەگەڵ ئەحنەفی کوڕی قەیسی گەورەیان لە ڕۆژی شەڕی جەمەل[٣٧] کەناریان گرت– پاشان گێڕانەوەی سەیف بۆ فیتنە لە ناخ و کرۆك وردەکاری خۆیدا سەرچاوەیەکی بێلایەن و شارەزاش لەیەك کاتدا پێکدەهێنێ.

لە مێژووی ئیمامی تەبەریدا گێڕانەوەی سەیفی کوڕی عومەر بۆ فیتنەی سەردەمی عوسمان(رضي الله عنه)و شەڕی جەمەل بە تەواوەتی لە چەند بەشێکی جیاجیادا دەردەکەوێت کە لە نێوەندی هەر بەشێکدا سەنەدی گێڕەرەوەکانی تەواوە. یەکێ لە لێکۆڵەران–

[٣٦] – جواد علي: موارد تاريخ الطبرى، مجلة المجمع العلمى العراقى، المجلد الثالث،(١٣٧٤ك/ ١٩٥٤ز)

[٣٧] – الطبري: تاريخ الرسل و الملوك،(ج٤ ص ٤٩٨، ٥٠٠–٥٠١)

ئەحمەد راتب عرموش – هەستاوە بە کۆکردنەوە و ڕێکخستنیان لە کتێبێکدا کە ناوی ناوە(الفتنة وقعة الجمل)[38] کە ژمارەی لاپەڕەکانی نزیکەی دووسەد و حەوت لاپەڕەیە، ئەو ژمارە زۆرەی گێڕانەوانە بەڵگەی ئەوەیە سەیفی کوڕی عومەر لای ئیمامی تەبەری لە کەسەکانی دی جێ متمانەتر بوو.

## دووەم: موحەممەدی کوڕی عومەری واقیدی:

سەرچاوەی دووەم واقیدیە، ناوی موحەممەدی کوڕی عومەری واقیدی مەدەنی دادوەرەکە لە ساڵی ٢٠٧ك/ ٨٢٢ز. مردووە، چەندین دانراوی هەیە خەتیب لە بارەیەوە دەڵێت: ئەو لەوانەیە کەە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهاندا باس دەکرێت، بە کتێبەکانی بوو بە سوارچاکی مەیدانی هونەرەکانی زانست وەك غەزاکان و ژیاننامە و الطبقات و فیقهیش. ئەو کەسێکی بەخشندە بوو و بەوە ناسرابوو.[39]

---

[38] – لە بەیروت لە(دار النفائس)لە ساڵی ١٣٩١ك/ ١٩٧٢ز. چاپکراوە.

[39] – الخطیب:تاريخ بغداد،ج٣ ص٣

واقیدی بە یەکێ لە تێگەیشتوانی زانست دادەنرێت،[40] بەڵام تۆمەتبار کراوە و وەلانراوە سەرەڕای فراوانی زانستەکەی.[41] ئەو لە زانایانی غەزا و ژیاننامە و فتوحاتەکانە. چەندین نووسینی هەیە، دوای مردنی کۆگایەکی گەورەی بەجێهێشتووە. یەعقوبی کوڕی شەیبە دەڵێت:[42](کاتێ واقیدی لە بەرەی ڕۆژئاواییەوە — لە بەغداد گواستیەوە دەڵێن کتێبەکانی بە سەد و بیست بار گواستەوە، یان دەڵێن: شەش سەد کۆڵ کتێبی هەبووە).

واقیدی چەند باسێکی گرنگی ناو مێژووی هێناوە و لەسەر فتوحات و ڕووداوەکانی سەردەمی ئیسلام وەك ڕووداوی سەقیفە و هەڵگەڕانەوە و شەڕی جەمەل و صیفین و خەواریج و فتوحات کتێبی نووسیوە. زۆربەی ئەو کتێبانە فەوتان مەگەر هەندێ لەوانە کە لە مێژووەکەی ئیمامی تەبەری و نووسینەکانی دیکەدا شتێکیان لێ هاتبێت.

---

[40] – الذهبی: المیزان،ج٣ ص ٦٢٢.

[41] – ابن حجر: التقریب،ج٢ ص١٩٤.

[42] – یەعقوبی کوڕی شەیبەی کوڕی صەلتی کوڕی عصفوری سدوسی ئەبو یوسفە، فەرموودەناسی جێ متمانە و فیقهناسی سەر بە مەزهەبی مالیك بووە،(المسند الکبیر المعلل)هی ئەوە، لە ساڵی ٦٢٢ك، ٨٧٥ ز.مردوە.

ئـیبن نـەدیم باسـی نزیكـەی سـی(٣٠)نووسـینی دەكـات. لەوانـەی(التـاریخ الكـبیر)و(المغـاری)و(الـردة)و(الجمـل(و(صـفین)و(الطبـات)و(فتـوح الشام)و(فتوح العراق)و(مقتل و الحسین)و(تصـنیف القبائـل و مراتبهـا و انسابها)و جگە لەوانەش.[٤٣]

واقیـدی گرنگـی داوە بـە ڕێكخسـتنی مێـژوویی بـۆ ڕووداو و غـەزاكان، هـەروەك گرنگـی داوە بـە باسـكردنی ئـەو كەسـانەی لـە شـەڕدا بـە بەخشـین یـان ڕاوێـژ و ڕا یـان هەڵوێسـتێكی پاڵەوانانـە پشـكی دیاریكراویـان هـەبووە، باسـی دیلـەكان و شـەهیدانی موسـڵمانان و كـوژراوانی بێبـاوەڕان دەكـات و بـە پێـی هۆزەكانیـان ڕیزبەنـدییان دەكـات. هـەروەك هەرچـی موسـڵمانێ لـە بـەدردا بەشـداری كردبـێ لەبـەر نیشـاندانی جێدەسـتیان باسـی هـەموویان دێنێ.[٤٤]

هـەروەك گرنگیـدانی بـە دیـاریكردنی شـوێن و پێگـە جوگرافیەكان دەردەكەوێت تا ئەوەی خۆی لەسەری دەوەستا.

[٤٣] – ابن الندیم، ص ١٤٤.

[٤٤] – الواقدی: المغازی، بڕوانە بەشی یەكەم.

خەتیب لە باسی ژیانیدا لێوەی دەگێڕێتەوە و وتویەتی:
بەهەرکەسێ لە نەوەی هاوەن و شەهیدان و بەهەر مەولایەکیان گەیشتبم پرسیارم لێکردووە ئایا هیچت لەکەس و ماڵت بیستووە کە لەسەر شەڕەکەی قسەی بۆ کردبێت و هەروەها لە کوێ کوژراوە، ئەگەر پێی وتبم چووم بۆ شوێنەکە تا لێی بڕوانم.[٤٥]

بۆیە واقیدی بە جیا لەوانی دی زۆرتر وەسفی شەڕەکان دەکات و لە باسی ڕووداوە لابەلاکان دا تەنها زانیاری لای ئەو بەدی دەکرێت. لەوانەیە هەر ئەم بوو بێت کە زەهەبی لە وەسفیدا دەڵێت(لوتکەی غەزا و ژیاننامەکانە).[٤٦]

سەبارەت بە متمانە بەخشین واقیدی: زانایانی جەرح و تەعدیل چەندین قسەیان لەسەر دادپەروەری ئەو هێناوە، زۆرینەیان ڕەخنەی لێ دەگرن و هەندێکیش بە جێ متمانەی دەزانن، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە بارەیەوە دەڵێت:(درۆزنە و فەرموودە هەڵدەگێڕێتەوە)ئیبن موعین دەڵێت(فەرموودەی نانوسرێتەوە)موررە دەڵێت(هیچ نییە)[٤٧]بوخاری و ئەبو حاتەم دەڵێن(وەلا نراوە – متروك)[٤٨] نەسائیش

---

[٤٥] – بە وەرگرتن لە الخطیب: تاریخ بغداد، ج٣ ص ٦.
[٤٦] – الذهبی: التذکرة، ج١ ص ٣٤٨،
[٤٧] – ابن معین: التاریخ، ج٢ ص ٥٣٢.

**هەمان ڕای هەیە.[49] دارقوتنی دەڵێت(لاوازیەکی تێدایە)[50] ئیبن عەددی دەڵێت:(فەرموودەکانی پارێزراو و لەبەرکراو نین و بەلاَیش لەوەوەیە)ئیبن مەدینی دەڵێت[51]:(جێی گێڕانەوە نییە و ئیبراهیمی کوڕی ئەبو یەحیا درۆزنە و لای من ئەو لە وایدی باشترە).[52] ئەبو زەرعە دەڵێت:(فەرموودەی بۆ ئیعتیبار دەنوسرێتەوە).[53] ئەبو نەعیمی ئەسبەهانی دەڵێت:(وەلا نراوە).[54]موسعەبی زوبەیری دەڵێت[55]:(جێی**

=

[48] – البخاری: تاریخ الکبیر(۷۷/۱/۱)، ابن ابی حاتم: الجرح و التعدیل ج۸ ص ۲۰.

[49] – النسائی: کتاب الضعفاء و المتروکین، ص ۲۱۷.

[50] – الدار قطنی: الضعفاء، ص ۳٤۷.

[51] – عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی جەعفەری سەعدی مەدینی بەسری مێژوونوسی فەرموودە ناس لە گەورە فەرموودە ناسانی سەردەمی خۆیەتی، لە نوسینەکانی(الاسامی و الکنی)و(الطبقات)و(الضعفاء)و(علل المسند)و..هتد. لە ساڵی ۲۳٤ ك. مرد

[52] – ابن حجر: التذهیب، ج۹ ص ۳٦۷.

[53] – ابن ابی حاتم: الجرح و التعدیل، ج۸ ص ۲۱.

[54] – ابو نعیم: کتاب الضعفاء، ص ۱٤٦

[55] – موصعەبی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موصعەبی کوڕی پابتی زوبەیری ئەسەدی مەدەنی لە هەمووان زیاتر شارەزای(الانساب)بوو. ئیبن موعین و دار قوتنی بە جێ متمانەی دەزانن لە ساڵی ۳۲٦ ك. مرد.

متمانە نییە)،[56] ئیبن سەعد دەڵێت(شارەزای غەزاکان و ژیاننامە و فتوحات و ناکۆکی و کۆبوونەوەی خەڵکی لەسەر فەرمووده و ئەحکامە).[57]

زەهەبی دەڵێت(زانیاری کۆکردەوە و لێی تێگەیشت و پاك و پیسی تێکەڵ کرد، بۆیە فڕێیان داوە، لەگەڵ ئەمەشدا لە باسی غەزاکان و ڕۆژانی ژیانی هاوەڵان و زانیاری لەسەر ژیانیان ناکرێت بێ باکی لە ڕوودا بنوێنرێت)[58]، پاشان لە کۆتایی ژیاننامەیدا دەڵێت:(بڕیار درا بەوەی واقیدی لاوازە و لە باسی غەزاکان و مێژوودا پێویستی پێی هەبێت، ئەپەرەکانی بەبێ پێویستی دەهێنرێت. بەڵام سەبارەت بە فەرزەکان نابێت باس بکرێت، ئەوە لەبەر دەستدا کتێبەکانی سوننەت و موسنەدی ئەحمەد و ئەوانی دی لە کۆکردنەوەی ئەحکامدا هەن کە لە تەخریجی فەرموودەکاندا مۆڵەت بە کەسانێکی لاواز و وەلانراو دەدەن لەگەڵ ئەوەشدا شتێ لە قسەی موحەممەدی کوڕی عومەر ناهێنن، سەرەڕای ئەوەی

---

[56] – ابن حجر: التذهيب: ج٩ ص ٣٦٦.

[57] – هەمان سەرچاوە، ج٩ ص ٣٦٥.

[58] – الذهبی: سير الاعلام النبلاء، ج٩ ص ٤٥٤.

کێشـــی لـــەلای مـــن ئەوەیـــە لەگـــەڵ لاوازیەکەیـــدا فـــەرموودەی دەنوسـرێت و دەگێڕدرێتـەوە. چـونکە مـن تۆمـەتباری ناکـەم بـە فەرموودە هەڵبەستن قسەی ئەوەش کە زۆر لەسـەری دەخوێنێـت سەرکێشییە لە چەند لایەکەوە، هەروەك هیچ پەندیێ نییە بە متمانە بەخشین ئەوەی متمانەی پێ بەخشیوە، چونکە ئیجماعی ئەمڕۆ لەســەر ئەوەیــە کــە ئــەو بەڵگــەی نییــە و فــەرموودەی لــە ڕیزی(الواهی)دایە.[٥٩]

ئیبن سەیدونناس[٦٠] پاش وەرگرتنی قسە لەسر دادپەروەری واقیدی لە پێشەکی کتێبەکەیدا(عیون الاثر)دەڵێت:(فراوانی زانست گومـانخوازی زۆری شـتی نامۆیـە، زۆری نـامۆش گومـانخوازی تۆمەتە، واقیدیش لە فراوانی زانستدا قسەی لەسەر نییە، بۆیە نـامۆیی زۆری لەلایـە.... لـەوەوە شـت گـەلێکمان گێڕاوەتـەوە لـە

---

[٥٩] – هەمان سەرچاوە، ج٩ ص ٤٦٩.

[٦٠] – محەممـەدی کـوڕی موحەممـەدی کـوڕی موحەممـەدی کـوڕی ئەحمـەدە، ئـیبن سیدونناسـی یـەئموری ڕەبعـی میسـری ئـەبو لفـەتح: فـەرموودە ناسـی مێـژووناس و ئـەدیب. چـەند کتێبێکـی هەیـە، لەوانـە(عیون الاپرپـی فنـون المغازی و الشمائل و السیر)،(تعصیل الاصابه فی تفیضل السعابه)، ساڵی ٧٣٤ك. ١٣٣٤ز. مرد

بەدواداچوونی شوێنەواری ڕووداوەکان و پرسیارکردنی لە کوڕانی هاوەڵان و شەهیدان لەسەر باری پێشینەیان بەمە گێڕانەوە و هەواڵ گەلێکی زۆری هێناوە کە تەنها لای ئەو هەن).[٦١]

واقیدی لە بەکار هێنانی سەرچاوەکانیدا بەزۆری دەقی(بلغنی)[٦٢] یان(حدثنی من اثق به) (کەسێ کە متمانەم پێی هەیە پێی وتم).[٦٣] دێنێت، بەبێ ئەوەی بە ڕوونی ناوی گێڕەرەوە بهێنێت، ئەمەش بێ ئاگا کردنێ لە سەرچاوەی گێڕانەوەکەی تێدایە. لە سەروو ئەمەشەوە باسی سەنەدەکانی سەرچاوەکانی بەشێوەیەکی کۆمەڵ دەکات.[٦٤] جا لەبری ئەوەی پێش هەواڵەکان یەك یەك سەنەدەکان بهێنێت سەنەدەکانی کتێبەکانیان سەرچاوە بەکارهێنراوەکان لە سەرەتای هەر بەشێکەوە دەهێنێت، تا ئەوەی ناتوانێت ئەو وەرگرتنانەی لە سەرچاوە جیاجیاکەنەوە وەریگرتووە جیا کاتەوە.

---

[٦١] – ئیبن سەیدونناس: عیون الاثر، ج١ ص ٢٦ – ٢٧

[٦٢] – الواقدی: فتوح الشام ، ص١٤ – ١٨.

[٦٣] – هەمان سەرچاوە ١٦٣

[٦٤] – هەمان سەرچاوە ص ٥.

ئەوەی لە قسەی ڕەخنەگران لە واقیدیەوە دەردەكەوێت ئەوەیە گێڕانەوەكانی لەسەر مێژوو ژیاننامە وەردەگرێت ئەگەر لەگەڵ گێڕانەوە صەحیحەكاندا پێچەوانە نەبێت، چونكە ئەگەرقسەیەكی بەتەنها هێنا ئەوكات قسەی بەڵگە نییە، جا ئەگەر كەسی لەو جێ متمانەتر شتی هێنا ئەوا وەردەگیرێت.

ئیبن نەدیم – كە لە رافیزەكانە– دەڵێت واقیدا شیعە بووە مەزهەبی باشی گرتووەتەبەر – واتە مەزهەبی رافیزە– پەیوەستی تەقیە بووە،[٦٥] هەروەك خوانساری و شیعەكانی دیكەش لە كتێبەكانیاندا ژیاننامەی دەهێنن.[٦٦]

بەڵام قسەی ئەوانە بەڵگەمان پێ نابەخشن. بەڵگەیەكی بەرچاویان لەسەر شیعە بوونی واقیدی نییە. چونكە سروشتی ڕافیزەكان درۆكردنە و فێرن هەندێ لە گەورە زانا دیارەكان بدەنە پاڵ خۆیان لە پێناو زۆر دیاربونیان و بانگەشە كردن بۆ مەزهەبەكەیان، كتێبێك هەیە بە ناونیشانی(فلاسفة الشيعة)كە یەكێ لە شیعەكانی بەناوی شێخ نەعیمە نووسیویەتی تیایدا زۆرێك لە زانایان دێنێ و دەیانداتەوە پاڵ شیعە.

---

[٦٥] – ابن النديم: الفهرست، ١١١

[٦٦] – روضات الجنان، ج٧ ص ٢٦٨.

هێنـدەی مـن ئاگـادار بم هـیچ لـە زانایـانی ئـەهلی سـوننە- لەوانـەی ڕەخنـەیان لێگرتـووە – بـەهۆی بیدعـە یـان شـیعەبوون تۆمـەتباری ناکـەن، بـەڵکوو لەبـەر لاوازی لـە فـەرموودەدا وەلایـان نـاوە، ئیمـامی تەبـەری لـە باسـی ژیـان و غـەزاکان و فتوحـات و مێـــژووی خیلافەتـــدا ســـوودی لـــە نووســـینەکانی واقیـــدی وەرگرتووە(٨١٦)گێڕانەوەی لێ هێناوە، لەوانە(٤٣)دانەیان لەسـەر فیتنـەن. جـا لەباسـی قسـەی تەبـەری لەسـەر فیتنـەو سـەردەمی عوسمـــانﷺ...ئـــەو سەرچـــاوەی کـــە لای بـــەلادا کردووەتـــەوە گێڕانەوەکانی واقیدین.

کـە سـەرەڕای ئـەوەی ڕەخنـە لـە گێڕانـەوەی دەگرێـت و دەڵێـت وازی لــە زۆرێکــی هێنــاوە(واقیــدی لــە باســی هۆکــاری چــوونی میسریەکان بۆلای عوسمان و دابەزینیان چەند شتێکی گومانـاوی دێنێـت لەوانـە شـتێ لـەوەی کـە پێشـتر باسـی کـرا، یـان لـەوەی کـە لەبەر دڕندەییەکەی نەم هێناوە).[٦٧]

---

[٦٧] – الطبری: تاريخ الرسل و الملوك، ج٤ ص ٣٥٦.

## مامۆستاکانی واقیدی

**موحەممەدی کوڕی صاڵحی کوڕی دیناری مەدەنی تەممار[٦٨]**

کەوا ئەڵەقی پەیوەندی نێوان واقیدی و عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادی زوفەری[٦٩] خاوەنی نووسی لەسەر غەزاکان دادەنێت، واقیدی لەو ڕێگەوە قسەی لە عاصمەوە هێناوە، ئەم کەسەی دوایین لای ئیمامی تەبەری پێگەیەکی بێ گرفتی داگیر کردووە، ئەوەتا لە باسی ڕووداوەکانی ساڵی( ٣٥ك، ٦٥٥ز)دا لە

---

[٦٨] – موحەممەدی کوڕی صاڵی کوڕی دیناری تەمار ئەبو عەبدوڵلای مەدەنی، فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی موحەممەدی کوڕی مونکەدر و زوهری جگە لەوانیش، ئەحمەد و ئەو داود و عەجلی جێ متمانە و ئیبن سەعد بە بیر و هۆش چاك ناوی دەبا. لە ساڵی ١٦٨ ك، ٧٨٤ ز. مرد

[٦٩] – عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەی کوڕی نوعمانی زوفەری ئەنساری مەدەنی ئەبو عومەر یەکێکە لە زانایانی تابعین، کە ڕەخنەگران هەموو بە جێ متمانە و گەورە و شارەزا بە غەزاکانی دەزانن، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز فەرمانی پێ کرد لە مزگەوتی دیمەشق دا بنیشێ و باسی غەزاکان و پلەو پایەی هاوەڵان بکات بۆ خەڵك، ئەویش وای کرد کەسێکی جێ متمانە و زانابون، فەرموودەی زۆرە.لە ساڵی ١٢٦ك، ٧٤٣ز. مرد

باسـی قسـەکردن لەسـەر فیتنـە و ئاشـووبی سـەردەمی عوسمان:(باسی هاتووە)[٧٠]

لەو گێڕانەوانەی کە ئیمامی تەبەری لە واقیدی لە موحەممەدی کوڕی صاڵحەوە هێناویەتی و موحەممەد لەسر ڕۆژانـی عومـەر و عوسمان و فیتنەی دسردەمی عوسمان هێنانی ئەوە دەردەکەوێت کە ئـەو خـاوەنی نوسـینە لەسـەر مێـژووی خەلیفە ڕاشیدینەکان و زۆر گرنگە و واقیدیش پشتی پێ بەستووە.[٧١]

## سێیەم: عومەری کوڕی شوبەی نومەیری:

سەرچـاوەی سـێیەم ئـەبو زەیـد عومـەری کـوڕی شـوبەی نومـەیری بەسـری فەرمـوودەناسـی گێـڕەرەوەی جـێ متمانەیـە کـە لەساڵی ٢٦٢ك/ ٨٧٥ز. دا مرد.

ئەوانەی ژیانیان نووسیوە باسیانکردووە کە زمان ڕاست بووە، گێڕانـەوەی نەهێناوەتـەناو شـارەزای ئەپـەرەکان و گێـڕەرەوەی هەواڵەکان بووە، ئەدیب و فیقهنـاس و خـاوەنی دچند دانراوێکـە،

[٧٠] – الطبری: التاريخ الرسل و الملوك ج٤ ص ٣٥٩.

[٧١] – جـواد علـی: مـوارد تـاريخ الطـبری، العـدد الثالـث(١٣٧٤ ه، ١٩٥٤م)ص ٥٦.

**شارەزای خوێندنەوەکانی قورئان و بەرچاو ڕوون بە ژیاننامە و غەزاکان و مێژووی خەڵکە.[٧٢]**

**ئیبن ئەبی حاتەم لە بارەیەوە دەڵێت:(لەگەڵ باوکم شتم لێوە نووسیوە، ئەو کەسێکی زۆر ڕاستگۆ و خاوەن زمانی عەرەبی و ئەدەبە)[٧٣] دار قوتنی دەڵێت(جێ متمانەیە)[٧٤] ئیبن حبان لە جێ متمانەکاندا ناوی دێنێ و دەڵێت(فەرموودەی ڕاستە، خاوەنی ئەدەب و شیعر و هەواڵە و شارەزای مێژووی خەڵکە)٤[٧٥] خەتیب دەڵێت(جێ متمانە و شارەزا بە ژیاننامە و مێژووی خەڵکە و چەندین دانراوی هەن).[٧٦]**

**ئیبن شوببە فەرموودەی لە چەند زانایەکی جێ متمانەی سەردەمی خۆی بیستووە و گێڕاوەتەوە، ئە ماموستایانەی لەوکاتەدا بەشەکانی مەعریفەیان دەگرتەخۆ وەك ئیبن مەهدی و**

---

**٧٢ – ئیبن الندیم: الفهرست، ص١٦٣.**
**٧٣ – ابن ابی حاتم: الجرح و التعدیل ج٦ ص ١١٦.**
**٧٤ – ابن حجر، التهذیب ج٧ ص ٤٦٠.**
**٧٥ – ابن حبان: الثقات ج٨ ص ٤٤٦.**
**٧٦ – الخطیب: تاریخ بغداد ج١١ ص ٢٠٨.**

قوتتـان لـه فـەرموودە و ئەصـمەعی لـه ئـەدەب و مـەدائینی لـه مێـژوودا، هـەروەك ژمارەیـەكی زۆری زانایـان فـەرموودەیان لێگێڕاوەتەوە وەك ئیبن ماجه و پەعلەبی نەحوی ناسراو و بەلازەی و ئـیبن ئـەبی دنیـا و بەغـەوی خـاوەنی(الصـحیح)و چـەندێكی دیكەش.[77]

عومـەری كوڕی شوببە لـه چەندین بـواری مەعریفـەدا چەندین نووسـینی بەجێهێشـتووه بـەجۆرێ ئـیبن نـەدیم نزیكـەی سـەروو بیسـت دانـراوی دێـنێ. لەوانـه ئـەوەی پەیوەنـدی هەیـه بـه ڕووداوەكـانی فیتنـەوە(مقتـل عثمـان)و(اخبـار الكوفـة)و(اخبـار البصرة)[78] ئیبن حەجەریش لەو كتێبەی ئیبن شوببە لەسەر بەسرە دەقێكـی دوورو درێـژی بـۆ(فـتح البـاری)ەكـەی وەرگرتـووە كـاتێ دەڵێت(عومەری كوڕی شوببە لە كتێبی(اخبار الكوفة)دا بە دوور و درێژی چیرۆكی جەمەلی هێناوە و منیش لێرەدا كورت و پوختی دەكەمەوە بەوجۆرەی بە سەنەدی صەحیح یان حەسەن هێنایەتی

---

[77] – ابن حجر: التهذيب ج٧ ص ٤٦٠.
[78] – ابن النديم: الفهرست ص ١٦٣.

جگە لـەوەش ڕوون دەکەمـەوە)[79] ئـەمڕۆ نوسـینەکان ئـیبن شـوببە لەبــەر دەســت نــین جگــە لــە کتێبــی(المدینــة)کــە ئێســتا بــە ناونیشانی(تارخ المدینة)چاپکراوە.[80]

بەشی سێیەمی بۆ ژیانی ئـەمیری باوەڕداران عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه)لیٚ وەردەگرێت کە بە تایبەت مەبەستی ئەوەیە خەڵکی لەسـەر یـەك نوسـخەی قورئـان و هۆکارەکـانی ئـەوە کۆکردوەتـەوە چۆن قورئانی نوسیەوە و چۆن هەندیٚ جۆری ڕابواردن چووە ناو ژیانی کۆمەڵگەی مەدەنی و باسـی دژایـەتی ئـەمیری باوەڕداران بۆ یاری(النرد)((مار و پەیژە)( قوس البندق)و کۆترە فڕیٚ دەکات.

پاشان بە فراوانـی ڕووداوەکـان دێنیٚ و ئـەوەی لەسـر هەڵوێسـتی هاوەڵان گێڕدراوەتەوە و دەیهێنیٚ.

پاشان ئـەو کۆتاییـە دڵگرانـەی کـە ئـەمیری باوەڕداران تووشـی بـوو بـەرگریکار و دوژمنیشــی هــەبووە لــەوێوە دەرگاکـانی خراپـە بەڕووی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کرانەوە.

---

[79] – ابن حجر: فتح الباری، ج١٣ ص ٥٤.

[80] – چوار بەشە و(فهم محمد شلتوت)تەحقیقی کردووە و(دار الاصـفهانی)لە جەددە لە ساڵی ١٣٩٣ك/ ١٩٧٣ز. چاپی کردووە.

لەوانەیە دەقێكی كۆنمان نەبێ كە بەشێوەیەی بەرفراوان و وردەكاری وەك هی ئبن شوببەه چارەسەری ژیانی عوسمان(رضي الله عنه)و كۆمەڵگەی مەدەنی و ڕووداوەكانی فیتنەی كردبێ. مەگەر مێژووی دیمەشقی ئیبن عەساكیر كە وای لێ دەكات گرنگترین دەقە ئەصلیەكانی بەردەستمان بێت.

ڕێبازی نووسینەوەی ئیبن شوببەه لە كتێبی(تاريخ المدينة)دا ئەوەیە: هەواڵەكان بە شسەنەد و بەشێوەی كاری فەرموودەناسان دێنێ و سەنەدەكان كۆدەكاتەوە وەك پیشینەكانی وەك ئیبن ئیسحاق و واقیدی و جگە لەوان، بەڵام هەموو سەنەدەكانی(موصول)گەیشتوو نین. هەیانە سەنەدی موصول[81] و هەیانە مونقەتیع[82]هەیانە موعەلەقە[83]

هەروەها سەرچاوەكانی و كەسەكانی و لەجێ متمانە بووندا لە یەك ئاستدا نین، هەیانە وەرگیراو هەیانە بەرپەرچەدراوەیە. بۆ نموونە هەواڵ دەداتەوە پاڵ كەسی نادیار و دەڵێت(ئەبو غەسان

[81] – تاريخ المدينه ج٣ ص ٩٠٧

[82] – هەمان سەرچاوە ج٢ ص ٧٦٣.

[83] – هەمان سەرچاوە ج١ ص ١٧٦.

**وتی هەندێك لە مامۆستاكانمان بۆیان گێڕاینەوە...)[٨٤](ئەسمەعی لەوەیدا كە لە كەسی داوە كە متمانەم پێیەتی لێوەی گێڕاوەتەوە...)[٨٥](موحەممەدی كوڕی یەحیا– ئەبو غەسان – وتی كەسێك كە متمانەمان پێیەتی بۆی گێڕاینەوە)[٨٦](كەسێكی قورەیش هەواڵی پێدام)[٨٧]**

**ئەوەی جێی ئاماژەیە ئەوەیە ئیبن شوببەه لە گێڕانەوەدا مودەلەس نیە، دەبینی لە كەسێكەوە كە بەرزی و نزمی لە سەنەدەكەیە گێڕانەوە دێنێ. بۆ نمونە كاتێ لە ئەبو غەسانی كینانی مامۆستایەوە گێڕانەوە دێنێ جارێ دەڵێ( حدثنا ابو غسان)یان(حدثنا محمد ابن یحیا)[٨٨]و جارێ دەڵێت(قال ابو غسان)[٨٩] جاریش هەیە دەڵێت(حدثنا عن ابو غسان)[٩٠]لە شوێنی دیكەشدا دەڵێت(ومما وجدت فی كتاب ابی غسان)[٩١]**

---

٨٤ – هەمان سەرچاوە، ج١ ص ٦٢.

٨٥ – هەمان سەرچاوە ج١ ص ٢٩١.

٨٦ – هەمان سەرچاوە ج١ ص ١٦.

٨٧ – هەمان سەرچاوە ج٢ ص ٧٦٣

٨٨ – هەمان سەرچاوە ج١ ص ٦١ – ٧٩.

٨٩ – هەمان سەرچاوە ، ج١ ص ١٢٩.

ابن شوببەه لە(تاريخ المدينه)كەيدا ڕێبازی ئەو فەرمودەناسانەی نەگرتووتەبەر كە مێژووی شارەزاكانیان هێناوە و باسی ژیانی زانایانی و هاتووان بۆ ئەو شارە دەكەن وەك ئەوەی حاكم لە(تاريخ نيسابور)و خەتيب لە(تاريخ بغداد)و ئيبن عەساكير لە(تاريخ ديمشق)دا كردی.

بەڵكوو مێژوويەكی بنيادی و ڕامياری بۆ مێژوو هێناوە، گرنگی ئەو زانياريانەی لەسەرمەشخەڵەكانی مەدينە و ڕێ و بان و كێڵگە و شوێنی هۆزەكانی هێناويەتی و تۆمارە ڕووداوەكانی پێشينەترين دەقی ئەو بوارەيە.

ئيمامی تەبەری زۆرێ لە گێڕانەوەكانی ئيبن شوببە و نووسينەكانيشی دێنێ لەوەی پەيوەستە بە هەواڵی مەدينەوە وەك ڕووداوەكانی فيتنە لە خيلافەتی عوسماندا(رخ)يان ئەوەی پەيوەستە بە هەواڵی عێراق وەك دەرچوونی تەلحە و زوبەير و عائشە(رضي الله عنها)بۆ بەسرە و شەڕی جەمەل و ڕووداوی ديكەش.

---

=

[٩٠] – هەمان سەرچاوە ، ج١ ص ٦١.

[٩١] – هەمان سەرچاوە ج٢ ص ٦٨٨.

ئـەم گرنگیدانـەش لەبەرئەوەیـە ئـیبن شـوببە تایبەتمەندیـەکی هــەبووە ســەبارەت بــە میْــژووی مەدینــە و بەســرە بــەوەی دوو کتێبەکـەی(اخبـار المدینـة)(اخبـار البصـرة)بـە بنـەڕەتی پتـەوی میْـژووی سـەرەتای ئیسـلامی دادەنرێـت، ئیمـامی زەهـەبیش لـەو بارەیـەوە دەڵێـت(ئـیبن شـوببە مێژوویـەکی گـەورەی بـۆ میْـژوو نووسیوە و کتێبی لەسەر هەواڵ و مێژووی مەدینـە کـە مـن نیـوەیم دیوە پێشەوایەتیەکەی دێنیٚ)١.[92]

ئـەبو زەیـدی کـوڕی شـوببە لـە مامۆسـتاکانی ئیمـامی تەبـەری بووە، وا دیارە لێی بیستووە و مۆڵەتی لا وەرگرتووە و نوسینیشی لەســـەر نـــەریتی مامۆســـتایانی ئـــەوکات لـــە مۆڵەتـــدا بـــە خوێنـدکارەکانیان بـۆ گێڕانـەوە لێیـان دێتـە بەرچاو ئەگـەر توانـای زانســـتیان دەرکـــەوت. ژمـــارەی گێڕانـــەوەکانی تەبـــەری لـــە مێژووەکەیدا لە ئیبن شوببەوە دەگاتە سەد و شەست و نـۆ پارچـە، سی(٣٠)دانەیان لەسر مەسەلەی فیتنەن.[93]

---

[92] – الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٢ص٣٧١.
[93] – محمد أبوالفضل، ج١٠ص٣٤٨.

## چوارەم: ئەبو موخەنەف لووطی کوڕی یەحیا:

چوارەم سەرچاوەی سەرەکی لەسەر فیتنە لە مێژووەکەی ئیمامی تەبەریدا لووگی کوڕی یەحیای ناسراو بە ئەبی موخەنەف کە لە پێش ساڵی ١٧٠ك/ ٧٨٦ز. مردووە. چەندین نووسینی لەسەر ڕووداوەکانی ناو دەوڵەتی ئیسلامی هەیە، ئەحمەدی کوڕی حارپی خەززار دەڵێت: زانایان دەڵێن: ئەبو موخەنەف لە خەڵکانی دی زیاتریشی هەیە لەەسر عێراق و هەواڵ و فتوحاتی، مەدائینیش شارەزای خوراسان و هیند و فارس و واقیدی شارەزای حیجاز و ژیاننامەیە و هەموو لە فتوحاتی شامدا هاوبەشن).[٩٤]

ئیبن قوتەیبە لە بارەیەوە دەڵێت(خاوەنی هەواڵ و باسی ڕەچەڵەکە و زیاتر هەواڵ(مێژووی)لایە)[٩٥] ئەبو موخەنەف بۆ ڕووداوەکانی عێراق زیاترین گێڕانەوەی هەیە بەتایبەت کووفە، چونکە بنکەی شیعەگەری بووە، بۆیە گرنگیداوە بە بابەتەکانی خەواریج و شۆڕشە شیعیەکان و شۆڕشەکانی عێراق بە گشتی،

---

[٩٤] – الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٠ص٤٠٠.

[٩٥] – ابن قتيبة: المعارف.

زۆربەی جار گێڕانەوەی کووفی دێنێ، چونکه رای خەڵکی عێراقی لـه رای خـەڵکی شـام لـه لا پەسـەندتر بـووه، ئـەو هـەواداری عەلەویەکان و دژ بە ئومەویەکان بوو، بۆیە شیعە ئەبوو موخنەف بە گـەورە مێژوونووسـی خۆیـان دەزانـن تـا ئـەوەی یـەکێکیان لـە بارەیـەوە دەڵێـت:(ئـەبوو موخنـەف لـە گـەورە مێژوونووسـە شـیعەکانە، سـەرەرای بـە ئاشـکرا شـیعە بـوونی کەچـی زانایـانی سوننەش شتیان لێ وەرگرتووە وەك تەبەریو ئیبن ئه ثیر).[96] بەڵام شت وەرگرتنی سوننە لێی واتای پشت بەستنیان پێی نیە.

ئیبن نەدیم لیستێکی کتێبەکانی دێنێ کە نزیکەی پەنجا کتێب بون، لەوانـەی پەیوەسـتن بـە مەسـەلەی فیتنـەوە (کتـاب الشـوری و مقتل عثمان)و(کتاب الجمل)و(کتاب صفين)و(کتاب مقتل محمـد بن أبـي بكـر و الأشـتر و محمـد بـن أبـي حذيفـة)و (أهـل النهـروان و الخوارج)و(مقتـل علـی).[97] بـەڵام ئـەبوو موخنـەف جـێ متمانـە نیـەو لەبـەر شـیعەگەری تونـدی لادانـی لـە مەسـەلەی فیتنـەدا دیـارە،

---

[96] – آغابزرگ الطهرانی: الذریعة إلی تصانیف الشیعة، ج١ص٣١٢.
٩٧ – ابن الندیم: الفهرست، ص١٠٥-١٠٦.

زەهەبی لەو بارەیەوە دەڵێت:(هەواڵ گێڕەوەیەکی هیچ و بێ متمانەیە)[98] لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت:(لە دەستەیەکی نادیاران گێڕانەوەی هێناوە.ئەو هاوشێوەی سەیفی کوڕی عومەری تەمیمی نووسەری (الردة) و(عوانة ابن الحکم)ە).[99]

## ئەمە بەشێکە لەم سەرچاوە

أ.د. محمد أمحزون: تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة من روايات الإمام الطبري و المحدثين

تێبینی: لەبەر درێژخوازی پەراوێزەکان هەوڵماندا وە لەگەڵ ئەوپەڕی پاراستنی سپاردەی زانستیدا پوخت کردنەوە بۆ هەندێ لە پەراوێزەکان بەکاربهێنین.وەرگێڕ

لەگەڵ داوای نزای خێردا

وەرگێڕ

---

٩٨ – الذهبي: الميزان، ج٣ص٤١٩.

٩٩ – سير أعلام النبلاء، ج٧ص٣٠٢.